# بزووتنەوەی کەمالی

## و رووخاندنی خیلافەتی ئیسلامی

نووسینی

فارووق محمد محمد أمين

١٤٣٢کۆچی چاپی یەکەم ٢٠١١ز

# به ناوی خوای گەوره

**ناوی کتێب:** بزووتنەوەی کەمالی

**نووسینی:** فارووق **محمد محمد** أمین

بابەت: مێژوویی

**تایپ:** فارووق **محمد**

**چاپ: ماڵپەری ناوەندی ئەیووبی**

# پێشەکی

بزوتنەوەی کەمالی زادەی ئەو بارودۆخە بوو کە تورکیای پاشماوەی عوسمانی بە خۆیەوە بینی، ئەویش لە ئەنجامی دۆڕاندنی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، پاش ئەوەی لە پاڵ وڵاتانی ناوەند دژ بە وڵاتانی هاوپەیمانان چووە جەنگەکەوەو سەپاندنی چەندین مەرج و پەیماننامە بەسەریدا، وێڕای داگیرکردنی ئەنادۆڵ لەلایەن هاوپەیمانانەوە، کە ئەمەش شایانی قبوڵ کردن نەبوو لەلایەن گەلی تورکیاوە.

بزوتنەوەیکەمالی (١٩١٩–١٩٢٢) بە خاڵی وەرچەرخان دادەنرێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی، کە ئەنجامەکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی تورکی ناسیۆنالیستی عەلمانی لێکەوتەوەو دواجار کاریگەری لەسەر ڕوداوەکانی ناو تورکیاو ناوچەکە بە گشتی هەبوو.

سەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالی لە ئەنجامی چەندین هۆکاری دەرەکی و ناوخۆیی هاتە کایەوە، مستەفا کەمال توانی سود لە هەلومەرجی نێو دەوڵەتی ئەوکاتەی جیهان وەربگرێت، بە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ سۆڤێتءوەرگرتنی کۆمەك و یارمەتی لێی لەلایەك و ململانێی نێوان خودی هاوپەیمانان لەلایەکی ترەوە، هەروەها لەسەر ئاستی ناوخۆش توانی سود لە توانای بەشێکی بەرچاوی کوردەکان وەربگرێت بۆ سەرخستنی بزوتنەوەکەی، ئەمە وێڕای کەسایەتی بە توان و کاریزمایی مستەفا کەمال خۆی.

ئەم لێکۆڵینەوەیەمان دابەشکردووە بە سەردوو بەشدا، بەشی یەکەممان دابەشکردوو بەسەر دوو باسدا، لە باسی یەکەمدا باسمان

لە دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا کردووە، لە باسی دووەمیشدا تیشکمان خستۆتە سەر بارودۆخی دەوڵەتی عوسمان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، هەرچی بەشی دووەمیشە دابەشمانکردووە بەسەر سێ باسدا، باسی یەکەم تەرخانکراوە بۆ هۆکارەکانی سەرهەڵدان و کۆنگرەکانی بزوتنەوەی کەمالی و دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانی گەورە.

لە باسی دووەمیشدا باسمان لە پەیوەندییەکانی بزوتنەوەی کەمالی لەگەڵ هەریەك لە سۆڤیێت و کورد کردووە، باسی سێیەمیش تەرخانکردتوە بۆ گرنگترین جەنگەکانی بزوتنەوەی کەمالی و کۆنگرەی لۆزان، ئەمیش بە پشت بەستن بە چەند سەرچاوەیەك لە گرنگترینیان: د. ابراهیم خلیل احمد و د. خلیل علی مراد: ایران و ترکیا دراسە فی التاریخ الحدیث والمعاصر، هەروەها د. ابراهیم خلیل احمد و ئەوانی تر: مێژووی تورکیای هاوچەرخ، لەگەڵ کتێبی موقف التیار الاسلامی والتیار العلمانی فی ترکیامن القضیة الكردیة لە نوسینی د. ولید رضوان، جگە لە کتێبی القضیة الكردیة فی ترکیای د. حامد محمود عیسی و چەند سەرچاوەیەکی تر.

پاشان گومانی تێدا نیە هیچ کارێکی زانستی بێ گرفت و کەموکوڕی نیە، لە گرنگترین گرفتەکانی ئێمەش لەئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کەمی کات بوو بەهۆی سەرقاڵیمان بەخوێندن و کۆرساتەوە.

# باسی یەکەم

## دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا :

کاتێك جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا، دەوڵەتی عوسمانی پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ ئەڵمانیا دا هەبوو، چونکە بڕوای وابوو چاوتێبڕینی ئەڵمانیا بۆ ناوچەکانی عوسمانی کەمترە لەچاوتێبڕینی وڵاتە ئەورووپییەکانی تر.[1]

دەوڵەتی عوسمانی لە ٤ تشرینی دووەمی ١٩١٤ دا چووە جەنگەوە لە پاڵ وڵاتانی ناوەندا، ئەوەش وەك جێبەجێکردنی ئەو پەیماننامە نهێنیەی لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئەڵمانیادا لە ئابی ١٩١٤دا بەسترا.[2]

ئەنوەر پاشا فەرمانی بە کەشتیگەلی عوسمانی لە دەریای ڕەش کرد بەدەستکردن بە کردەوە سەربازییەکان

---

[1] د. عبدالوهاب عباس القيسى و اخرون: تاريخ العالم الحديث ١٩١٤-١٩٤٥، الطبعة الاولى، وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، ١٩٨٣، ص٢١.

[2] د.ابراهيم خليل احمدو د.خليل على مراد: ايران و تركيا دراسة فى التاريخ الحديث والمعاصر، بدون رقم الطبعة، دار الكتب، الموصل، ١٩٩٢، ص٢٢٥.

دژی ڕوسیا، و لە ٢٩ی تشرینی یەكەمی ١٩١٤دا كەشتیگەلی عوسمانی بۆردومانی بەندەرەكانی ڕوسیای لە دەریای ڕەش كردو چەند كەشتیەكی ڕوسی نقوم كرد.[٣] و باڵا دەستی بەسەر دەریای ڕەشدا بە دەستهێنا، بەمەش دەوڵەتیوسمانی لە دژی ڕوسیا و فەرەنسا و بەریتانیا چووە جەنگەوە،[٤] بەوەش ڕوسیا لە ٤ تشرینی دووەمو دوای تەنها یەك ڕۆژ بەریتانیا و فەرەنسا جەنگیان دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند.[٥]

ئیتیحادییەكان چوونە جەنگەوە بەمەبەستی هێنانەدی چەند ئامانجێك:

١. پیادە كردنی سیاسەتی بەتورك كردن لەسەرجەم ناوچەكانی دەوڵەتی عوسمانیو ئەو ناوچانەی كەوتونەتە ژێردەستی داگیركەری ئەورووپییەوە.

---

[٣] هەمان سەرچاوە: ل٢٢٥-٢٢٦.

[٤] ئێریك جەی. زوچەر:مێژووی هاوچەرخی توركیا، وەرگێڕانی، د. یاسین سەردەشتی، بێ ژمارەی چاپ، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١٩١.

[٥] د.ابراهیم خلیل احمدو د.خلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٥.

٢. رزگار كردنی ئەو ناوچانەی تورك نشینن لە ڕوسیا (قەفقاس و توركستان) و یەكخستنی.
٣. گێڕانەوەی ئەو ناوچانەی لەژێر دەستی عوسمانی چوونەتە دەرەوە وەك میسرو قوبرس و لیبیا و تونس و جەزائیر.
٤. دووبارە چەسپاندنەوەی دەسەڵاتی خیلافەت لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا.[٦]

بەم شێوەیە دەوڵەتی عوسمانی چووە جەنگەوە وێڕای ئەوەی ڕای گشتی عوسمانی و سەدری ئەعزەم سعید حلیم نەیاندەویست بچنە جەنگەكەوە، هەروەك چەند وەزیرێكی وەزارەتەكەی سعید حلیم دەستیان لەكار كێشایەوە وەك نارەزاییەك دژی چوونە ناوەوە بۆ ناو جەنگی یەكەمی جیهانی.[٧]

---

[٦] هەمان سەرچاوە: ل٢٢٦.

[7] الامير شكيب ارسلان: تاريخ الدولة العثمانية، جمع أصوله وحققه وعلق عليه: حسن السماحي السويدان، الطبعة الاولى، دار ابن كثير ودار التربية، دمشق –بيروت، ٢٠٠١، ص ٤١٤.

هێزەکان بەریتانیا دەستیان بە پێشڕەوی کرد بەرەو عێراق لە باشورەوە. کەشتیەلی بەریتانی لە ١٩١٤/١١/٦ فاو یان داگیر کردو هێزەکانیان لە عبادان دابەزاندو لەوێوە بەرەو باکور کشانو لە ١٩١٤/١١/٢٢دا بەسرەیان داگیر کردو بەوەش داگیرکاری بەریتانیا لە عێراق دەستی پێکرد.[٨]هێزەکانی بەریتانیا پێشڕەییان کرد بەرەو (عەممارە) و لە ٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٥ دا داگیریان کردو لە ٢٥ی تەمموزی هەمان ساڵدا ناسریەیان داگیر کرد، پاش چەند جەنگێکی خوێناوی لە شوعەیبیەو قورنە بەریتانیەکان بەتەواوی دەستیان بەسەر هەموو ویلایەتی بەسرەدا گرت.[٩]

پاشان هێزەکانی بەریتانیا لە ٣٠ ئەیلولی هەمان ساڵدا کوت یان داگیر کردو شەڕگەیشتە دەورووبەری فظاعة لەلای سلمان باك لەدوری ٣٠ کیلومەتر لە باشوری بەغداد، پاش

[٨] د. محمد على القوزى: دراسات في تأريخ العرب المعاصر، دار النهضة العربية، بيروت–لبنان، الطبعة الأولى١٩٩٩، ص١٨٠.

[٩] عبدالرزاق الحسنى: تاريخ العراق السياسى الحديث، الجزء الاول، الطبعة السابعة، دار الشؤن الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص٦٦.

هاتنی هاوکاری هێزەکانی عوسمانی، سوپای بەریتانیایان ناچار بە پاشەکشە کرد بۆ کوت و بەتوندی گەمارۆیاندان لە ٣ کانونی یەکەمی ١٩١٥ تا کۆتا ڕۆژی مانگی نیسانی ١٩١٦ بەردەوامبوو، سەرجەم هەوڵەکانی بەریتانیا بۆ شکاندنی گەمارۆکە شکستی هێنا ژەنەراڵ تاوزەند (فەرماندەی هێزە گەمارۆدراوەکە لە کوت) ناچار بوو لە ٢٩نیساندا خۆی بدات بە دەست سوپای عوسمانیەوە.[١٠]

عوسمانیەکان توانیان سەرکەوتنێکی تر لە گالیبۆلی (جناق قلعه) بەدەستبهێنن، کە شکستی بەهێرشی هاوپەیمانەکان لە گەروی دەردەنیل لە ١٩ شوباتی ١٩١٥دا هێنا، هەورەك ناچار بوون بە ئامادەکردنی هەڵمەتێکی زەمینی لە نیسانی هەمان ساڵداو جەنگ لەنێوان هەردوولادا بەردەوام بوو، لێرەدا کەسایەتی مستەفا کەمال وەك فەرماندەیەکی سەربازی دەرکەوت، واتر ناوبانگی پەیدا کرد، کە فەرماندەی کەرتی (انافارطة) بوو هێرشێکی سەرکەوتووی بەرپا کرد، بووە هۆی جێگیری بەرەکەو

[١٠] هەمان سەرچاوە: ل٦٧.

سەریکێشا بۆ ئەوەی بەریتانیەکان چاو بە کردەوەکەدا بگێڕێتەوە بە گشتی، لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنەدا پلەی میر لیوای پێدرا و ناسرا بە (مستەفا کەمال پاشا).[11]

پاش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی لەهەردوو بەرەی عێراق و شامدا ڕووبەڕووی چەند شکستێکی توند بۆوە هێزەکانی بەریتانیا لە ١١ ئازاری ١٩١٧دا بەغدایان داگیر کردو لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا گەیشتنە نزیك موسڵ، لەشامیشدا هێزە عەرەبییەکان بەیارمەتی بەریتانیا لەدیمەشق دەوڵەتیان ڕاگەیاند ناچار حکومەتی ئیتحادیەکان لە١٣ی تشرینی یەکەمدا دەست لەکارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیاندو ژمارەیەك لەسەرکردەکانیان ڕایانکرد،[12] بەمەش بۆشایی سیاسی باڵی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا کێشا بوو، لە ئەنجامی هەڵاتنی سەرکردەی ئیتیحادیەکان کە دەوڵەتی عوسمانیان خستە قەیرانێکی بێ دەرچەوە بۆ ئەورووپا، ئەوەش پاڵی بە

[11] د.ابراهیم خلیل احمدو د.خلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٦.

[12] هەمان سەرچاوە، ل٢٢٩.

**سوڵتان محمد ڕەشاد (محمدی پێنجەم ١٩٠٩-١٩١٨)و چینی فەرمانڕەوای کۆنەوە نا ملکەچی هاوپەیمانەکان بن،[١٣] و لە١٤ی هەمان مانگدا بەسەرکردایەتی ئەحمەد عیزەت پاشا حکومەتێکی نوێ دامەزرا، ئەم حکومەتە لە٣٠ی هەمان مانگدا بەمەر جەکانی ئاگربەستی مۆدرۆس ڕازیبوو.[١٤]**

---

[١٣] **قادر سليم شمو:موقف الكورد من حرب الاستقلال التركية ١٩١٩-١٩٢٢، الطبعة الاولى، مطبعة خانى، دهوك، ٢٠٠٨، ص٤٥.**

[١٤] **د.ابراهيم خليل احمدو د.خليل على مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٩.**

## باسی دووەم

## بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی:

لەئەنجامی شکستی دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا، هێزی هاوپەیمانان دەستیانگرت بەسەر گرنگترین بنکە سەربازیو ستراتیژیو ئابوورییەکانی وڵاتدا، هێزی هاوپەیمانان ئەستەمبوڵو قەڵاکانی دەردەنیلو بسفۆڕو گرنگترین شارەکانی وڵاتیان داگیرکردو لە١٣ی تشرینی دووەمی ١٩١٨دا چونە ناو قۆچی زێڕینەوەو هەوڵیاندا ئەستەمبول بکەنە بنکەیەك بۆ چالاکیەکانیان لەگشت وڵاتانی ناوچەکەدا[١٥].

پاشان بەریتانیا موسڵ و ئەسکەندەرونەی داگیرکرد بەبیانووی زامنکردنی هێڵەکانی(تمویل)ئازووقەپێدانی هێزەکانی، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەم ناوچانە لەژێردەستی عوسمانیدابوو لەکاتی ئیمزاکردنی ئاگربەستی مۆدرۆسدا، هەروەها عینتابو مەرعەشوئورفە و ئاسکی شەهروئەفیون

---

[١٥] د.ابراهیم خلیل احمدو ئەوانی تر: تورکیای هاوچەرخ، وەرکێڕانی، سامان مصطفی، چاپی یەکەم، چاپخانەی لاوکۆ، سلێمانی،٢٠٠٨، ل٢٣.

قەرەحەسارو کوتاهیەی داگیرکرد و دەستیگرت بەسەر هێڵی ئاسنینی بەغداد–ئەنادۆڵ و بەندەرەکانی دەریای رەشدا، هەروەها هێزەکانی ئینگلیز دابەزینە سامسۆن و تەرابزون، سەرەڕای ئەوەی هێزێکی تری ئینگلیز نێردرا بۆ ئەنکەرەو مەرزیفۆن.[١٦]

هەروەها هێزەکانی فەرەنسا مەرسین و ناوچەی ئەتنەو ناوچەی خەڵووزی بەردینی (زونکلداغ) یان داگیرکرد و لەپاییزی ١٩١٩دا شوێنی بەریتانیەکانیان گرتەوە لە ئەنتالیا و کوشاداسی، پاش ئەوە (قونیەو ئیسپارتەو بودرومو مارکی و مارماریس) یایان داگیرکرد.[١٧]

لە١٥ی ئایاری ١٩١٩دا بەبڕیارێکی کۆنگرەی ئاشتی پاریس هێزەکانی یۆنان هەستان بە داگیرکردنی ئەزمیر کە بەکەشتیە جەنگیەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و ویلایەتە یەکگرتووەکان دەپارێزرا.و ژمارەی هێزەداگیرکەرەکان لە

---

[١٦] هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

[١٧] مجموعة من الباحثين السوفيت: تاريخ تركيا المعاصر، ترجمة د.هاشم صالح التكريتي، مؤسسة حمدى، بدون رقم الطبعة، السليمانية، ٢٠٠٧. ص٣٠.

ئەنادۆڵ و تراقیادا لەسەرەتای ساڵی۱۹۱۹دا گەشتە ۱۰۷هەزار بێجگە لە یۆنانیەکان.[18]

لە ئاگربەستی مۆدرۆسدا هاتبوو کەدەبێت هەردوو گەروی دەردەنیڵ و بسفۆر بکرێنەوەو هاوپەیمانان قەڵاکانیان داگیربکەن و چەکی سوپای عوسمانی داماڵن و بورجە جەنگیە عوسمانیەکان بدرێن بەدەستەوەو هاوپەیمانان مافی ئەوەیان هەبێت هەرخاڵێکی ستراتیژی داگیربکەن کەجێی مەترسی بێت، کەشتیەکانی هاوپەیمانانیش بۆ بەندەرە عوسمانیەکان بەکاربێن و ئەفسەرە هاوپەیمانەکان سەرپەرشتی هەموو هێڵە ئاسنینەکان بکەن و هەموو سەربازگە عوسمانیەکان لە حیجازو عەسیرو یەمەن و سوریاو عێراق و بەندەرە عوسمانیەکانی باکووری ئەفریقا بدرێن بەدەستەوە، هاوپەیمانان مافی خۆیانە هەربەشێکی شەش ویلایەتە عوسمانیەکە داگیربکات.[19]

---

[18] هەمان سەرچاوە: ل۳۱.

[19] د.ابراهیم خلیل احمد و د.خلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل۲۲۹-۲۳۰.

مستەفا کەمال هەوڵیدا ئەو هەلومەرجە بۆبەرژەوەندی خۆی بقۆزێتەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی سوڵتان وەحیدەدین عیزەت پاشای لەسەر کار لابردو تۆفیق پاشای ڕاسپارد حکومەتێکی نوێ پێکبهێنێت، مستەفا کەمال لەگەڵ عیزەت پاشا لەسەر ئەوە ڕێککەوت کە دوای ئەوەی لەڕێی پەرلەمانی عوسمانیو لە سۆنگەی وروژاندنی هەستی نیشتیمانی پەرلەمانتاران ڕێگە بەحوکمەتی تۆفیق پاشا نادات متمانە بەدەست بهێنێت، ئەو کاتە دەبێت ئەو حوکمەتێك پێکبهێنێتوپۆستی وەزارەتی جەنگی پێبدات، مستەفا کەمال هەوڵیدا کە ئەندامانی پەرلەمانی عوسمانی دەنگ دژی حوکمەتی تۆفیق پاشا بدەن، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، لە کۆبونەوەی پەرلەماندا تۆفیق پاشا بەزۆرینەی دەنگ متمانەی پەرلەمانی بەدەستهێنا.[20]

بەمە سوڵتانو حکومەت بوونە گوێڕایەڵی بەریتانیو فەرەنسیەکانو ئەحمەد تۆفیق پاشا لەجیاتی ئەحمەد

---

[20] یونس یحیا برادۆستی: کورتەیەك لەژیانی مستەفا کەمال ئەتاتورك ١٩١٥–١٩١٨، گۆڤاری مێژوو،ژمارە٨، هەولێر،٢٠٠٨، ل٣٥٦.

**عیزەت پاشا حکومەتی گرتە دەست دوای ئەویش داماد فەرید پاشا هات کە هەواداری بەریتانیەکانو سەرکردەی حیزبی (الحریە والائتلاف) بوو، وحکومەتەکەی داماد بەبیانووی گێڕانەوەی هێمنیو ئاسایش کەوتە ئەنجامدانی چەند داگیرکاریەکی فراوانو دادگا سەربازیەکانی زیندوو کردەوە، ئەنجامی ئەمکارەی بوو بەهۆی لاوازبوونی دەسەڵاتەکەی.[٢١]**

[٢١] **مجموعة من الباحثین السوفیت: سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.**

## باسی یەکەم

## سەرهەڵدان و ئامادەکارییەکان بۆ بزوتنەوی کەمالی:

### هۆکارەکان و سەرهەڵدانی بزوتنەوەی کەمالی:

سوڵتان موحەممەد وەحیدەدین (موحەممەدی شەشەم) کەپاش مردنی سوڵتان مەحەممەدی پێنجەمی برای لە٣ی تەمووزی١٩١٨دا دەسەڵاتی گرتەدەست،کەوتە ژێرکاریگەری هاوپەیمانانەوەو فەرمانی دەرکرد بە تەسریحکردنی ژمارەیەکی زۆر لەهێزەکانی تورکیا، هەروەك ڕێگەی گرت لەهێزەکانی کە ڕووبەرووی یۆنانیەکان بوەستنەوە.[٢٢]

پرۆژەی پەیماننامەی ئاشتی لەپاریس پێشنیاری مانەوەی دەوڵەتێکی تورکی بچوکی لەناوەڕاستی ئەنادۆڵدا کردبوو بەسەرکردایەی سوڵتان، بەڵام لەژێر دەسەڵاتی هاوپەیمانەکاندا بێت، هەرچی ناوچەکانی ترە دابەشکرابوو لەنێوان دەوڵەتە ئیمپریالیەکاندا.[٢٣]

لەتوانای گەلی تورکیادا نەبوو گواستنەوەی وڵاتەکەیان بۆ داگیرگەیەك قبولّ بکەن، لەبەرئەوە نەچوونە

---

[٢٢] د.ابراهيم خليل أحمد و خليل علي مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣١.

[٢٣] د.ابراهيم خلبل أحمدو ئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤.

ژێر ڕکێفی ئیمپریالیەکانو خۆیان ئامادەکرد بۆ خەباتی چەکداری دژ بە داگیرکەران، سەرەڕای ئەو ماندووبوونەی بەهۆی جەنگەکەوە تووشیان بوو بوو.[٢٤]

لەم بارووددۆخەدا مستەفاکەمال کەوتە بیری یاخیبونو ڕاپەرین، ئەوەبوو سەرەتای ئەم بیرەی بەکەڵك وەرگرتن بوو لە فەرمانی سوڵتان وەحیدەدین بەناردنی بۆ ئەنادۆڵ وەکو سەرکردەی گشتی سوپای عوسمانی، تا هەوڵی پاراستنی ئاسایشی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا بدات.[٢٥]

هەرکە مستەفا پاشا گەیشتە هەردوو ویلایەتی ئەرزرۆمو سیواس، ئەو دوو ویلایەتەی کردە ناوەندی چالاکیەکانی، تەنانەت ڕایگەیاند ناتوانێت شکستی تورکیا قبوڵ بکات، بۆئەوە لەگەڵ ژمارەیەك لەهەوادارەکانی بڕیاری بەرگریکردنو بەرهەڵستکاری کارە ناڕەواکانی هاوپەیمانانیانداو هێرشیان کردە سەر سوڵتانو

---

[٢٤] مجموعة من الباحثين السوفيت: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢.

[٢٥] ماجد خليل: پارت ورێکخراوەکوردیەکان و بزوتنەوەی کەمالیزم، گۆڤاری کۆچ، ژمارە٧-٨، بێ شوێنی چاپ، ٢٠٠٨، ل ١٨.

حکومەتەکەی لە ئەستەمبوڵ، وەسفیان کرد بەوەی کە بوەتە دیلی دەستی هاوپەیمانان.[٢٦]

جێگیربوونی یۆنان لە ئەزمیر، هەستی زیندووبونەوەی ئیمپراتۆری بیزەنتی، هەموو ئەمانە ڕۆحی بەرگری لای تورك زیاترکرد، ئەوەبوو لەکانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ چەند کۆمەڵەیەکی نیشتیمانی کەناوی خۆیان نابوو کۆمەڵەی بەرگری لەمافەکان دامەزرا، ئامانجی ئەم کۆمەلأنە بەرگری بوو لەدژی هاوپەیمانان‌و لقەکانیان لە ئەزمیرو تورکیا وکلیکیا بلأوکردەوە، لەناوچەکانی ڕۆژهەلأتیش ترسی دروستکردنی دەوڵەتی ئەرمەنی کێشەیەکی تر بوو لەبەر ئەوە لەوێش زۆرێك لەکۆنە ئەندامانی ئیتیحادیەکان‌و پیاوانی ئاینی‌و جوتیار هاتنە ناو بزوتنەوەکەوە.[٢٧]

مستەفا کەمال دەستیکرد بەڕێکخستنی ناوەندی سەرکردایەتی بۆ بزوتنەوەی نیشتیمانی، دوای گەیشتنی بۆ ئەنادۆڵ هەر زوو بە چالاکیەکانی ناسرا بەشێوەیەك

---

[٢٦] د.ابراهیم خلیل أحمد وخلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣١.

[٢٧] ماجیدخلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل١٩-٢٠.

**مەندوبی سامی هاوپەیمانەکان جەختیان لە سوڵتان کردەوە لەمەڕ گرنگی مستەفا کەمال، سوڵتان وەڵامی دانەوە بۆئەوەش فەرمانی کرد بە مستەفا کەمال بەگەڕانەوەی بۆ ئەستەمبوڵو ئاگادارییان کرد بەوەی کارەکەی لە ئەنادۆڵ تەواو بووە، بەڵام مستەفا کەمال جێبەجێکردنی فەرمانەکەی سوڵتانی ڕەتکردەوەو دەست لەکارکێشانەوەی پێشکەشکردو بڕیاریدا لە ئەنادۆڵ بمێنێتەوە بۆئەوەی وڵات ئازاد بکات.[28]**

**مستەفاکەمال لەحوزەیرانی ١٩١٩دا لەئەماسیاوە بەهەمووناوچەکانی دەوروبەری ڕاگەیاند:**

**١-حکومەتی ئەستەمبوڵ توانای بەرپرسیارێتی نیەو سەربەخۆیی لەمەترسیدایە.**

**٢- پێویستە لەم پێناوەدا کار بۆ دامەزراندنی ڕێکخستنی نەتەوەیی بکرێت.**

**٣- پێویستە هەر ناوچەیەك سێ نوێنەر بەنهێنی بنێرێت بۆ سیڤاس.[29]**

---

[28] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو،ل٢٦.
[29] ماجد خلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

لەبەرئەمە حکومەتی ئەستەمبولْ بەسەرۆکایەتی داماد فەرید پاشا بڕیارێکی دەرکرد لە١١ی تەمووزی١٩١٩دا، تیایدا مستەفاکەمال پاشای بە دەرچوو لەیاسا دانا.بەڵام نیشتیمانیەکان لەدەوری کۆبوونەوەو کردیان بە سەرکردەی خۆیان، بەتایبەتی پاش بەستنی کۆبوونەوەی گشتی لە مزگەوتی شاری سامسۆن بە مەبەستی بەرزکردنەوەی گیانی بەرهەڵستکاری لەدەرونی خەڵکەکەدا، بەخێرایی پەیوەندیان کرد بە پاشماوەی یەکە سەربازییەکانی سوپای عوسمانی لە ئەنادۆڵو تراقیادا بۆچوونە ناو ڕیزەکانیانەوە، ڕێنماییشی نارد بۆ دەسەڵاتە مەدەنیو سەربازییە جیاوازەکانی ژێردەسەڵاتی، داوای لێکردن هەستن بەرێکخستنی خۆپیشاندانی نارەزایی دژی هاتنی یۆنانیەکان بۆ ئەزمیر، و دەستیکرد بە یەکخستنو بەهێزکردنی کۆمەلە جیاوازەکان (بەرگریکردن لەمافەکان لەئەنادۆڵو رۆمللی) لەبری جێبەجێکردنی ئەو فەرمانانەی لە ئەستەمبوڵەوە دەرکرابوو بۆ هەڵوەشاندنەوەیان.[٣٠]

---

[٣٠] د.ابراهیم خلیل أحمد وخلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣١-٢٣٢.

## کۆنگرەی ئەرزرۆم:

لە٢٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٨دا لە ئەماسیا کۆبونەوەیەکی نهێنی بۆ هەندێك لە سەر لەشکرەکانی سوپا بە سەرکردایەتی مستەفا کەمال بەسترا، تیایدا ئاماژەکرا بەوەی کە سوڵتان و حوکمەتەکەی هەوڵدەدەن بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی نیشتیمانی کە لەوڵاتدا پەرەی سەندبوو و بەهاوکاری دوژمنان دژی سەربەخۆیی وڵات کاریاندەکرد. لەم کۆبونەوەیەدا بڕیاری بەستنی کۆنگرەیەکیاندا بۆسەرجەم تورکیا لە سیۆاس.[31]

هەروەها لەم کۆبونەوەیەدا ڕیککەوتن لەسەر داوای کۆمەڵەی بەرگری لەمافی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات و بەستنی کۆنگرەیەك بۆ ئەم کۆمەڵەیە لە ئەرزڕۆم.[32] و ئەم کۆنگرەیە لە ئەرزڕۆم لە٢٣ی تەموزی ١٩١٩دا بەسترا، کۆنگرەکە بڕیاریدا بە پاراستنی ئاسایشی ئەنادۆڵی تورکیا و بانگەوازی بۆ گەلی

---

[31] مجموعة من الباحثين السوفيت: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨.

[32] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦.

**تورکیاو هێزە نیشتیمانیەکان کرد تا بەرگری لێبکەن، ئەمەش دەقی بڕیارەکانی کۆنگرەکەیە:**

**١. نیشتیمانی تورکی یەکەیەکی لێکدانەبڕاو پێکدەهێنێت.**

**٢. بەرهەڵستکاریو بەرگریکردن دژی هەموو جۆرە داگیرکاریەکی بیانی تەنانەت ئەگەر حکومەتی عوسمانیش بڕوخێت.**

**٣. ئەگەر حوکومەتی ئەستەمبوڵ نەیتوانی ئاسایشو سەربەخۆیی بپارێزیت، ئەوا حکومەتێکی کاتی لە ئەنادۆڵ دادەمەزرێت.**

**٤. هیچ جۆرە ئینتیداب یان پاراستنێك جێی قبوڵ نییە.**

**٥. کارکردنی خێرا لەسەر کۆکردنەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانیو چاودێری کردنی کارەکانی حوکومەت.**[٣٣]

---

[٣٣] **د.ابراهیم خلیل أحمد وخلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٢.**

لەڕاستیدا کۆنگرەی ئەرزرۆم نەیتوانی دامەزراندنی ناوەندێکی یەکگرتوو بۆ سەرکردایەتی بزوتنەوەی نیشتیمانی دەستەبەر بکات، بەڵام بارودۆخی ڕەخساند بۆ دامەزراندنی ناوەندێکی هاوشێوەی ئەمە لەکۆنگرەی سێواسدا.[٣٤]

[٣٤] مجموعة من الباحثين السوفيت: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩

## کۆنگرەی سێواس:

کۆنگرەی سێواس لەماوەی ٤-١٢ی ئەیلولی١٩١٩دا گرێدرا بەبەشداری ئەفسەرو مافناس‌و نوێنەری دەستەی ڕۆشنبیرە ئەستەمبوڵیەکان‌و ژمارەیەك لەدەرەبەگ‌و سەرۆك هۆزو بازرگانەکان و پێشنوێژو وتارخوێنەکان بەشدارییان تێداکرد، دروشم و بانگەشەی کونگرە (ڕزگارکردنی وڵات لە مەترسی دابەشبوون) بوو.[٣٥]

کۆنگرەکە بنەما سەرەکیەکانی دیاریکرد بۆ خەبات کردن لەپێناو سەربەخۆییدا، و بریاری لەسەر بەرنامەیەکی فراوانداو لەبڕیارەکانیدا ئاماژەی کرد بەوەی ئەو زەویانەی دەکەونە چوارچێوەی ئاگربەستی مۆدرۆس یەکەیەکی لێکدانەبراون‌و نابێت لە دەوڵەتی تورکیا دابرنرێت بەهەر شێوەو لەژێر هەر بیانوویەکدا بێت.[٣٦]

هەروەها کۆنگرە بڕیاری گوێنەدان بەفەرمانەکانی حکومەتی سوڵتانی دەرکرد، داوای کرد پەلە بکرێت لە

---

[٣٥] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

[٣٦] مجموعة من الباحثين السوفيت: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩.

دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتیمانی کە بڕیار لەسەر چارەنووسی وڵات بدات، سەرەرای ئەوەی کە بڕیاری یەکخستنی ڕێکخراوو کۆمەڵەکانی دا، لەرێکخراوێکدا بەناوی (کۆمەڵەی بەرگری لەمافەکانی ئەنادۆڵ و تراقیە).[٣٧]

هەر لەم کۆنگرەیەدا لیژنەی نوێنەران بەسەرکردایەتی مستەفا کەمال هەڵبژێردراو ئەم لیژنەیە بوو بەناوەندی سەرکردایەتی خەبات دژ بە داگیرکەران تاوەکو بەستنی ئەنجومەن لە ئەنقەرە لە نیسانی ١٩٢٠دا.[٣٨]

---

[٣٧] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

[٣٨] مجموعة من الباحثینالسوفیت: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩.

## ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورە:

لە١٩ی ئازاری١٩٢٠دا ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورە پێکهێنراو یەکەم کۆبوونەوەی خۆی لە ئەنقەرە لە٢٣ی نیسانی ١٩٢٠دا گریدا، مستەفاکەمال بە سەرۆکی ئەم ئەنجومەنە هەڵبژێردرا. لە ئەرکەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورە بریتیبوو لە جێبەجێکردنی پەیمانی نیشتیمانی کە لە٢٨ی کانوونی دووەمی ١٩٢٠دا لەسەری رێککەوتبوون. ئەم پەیمانە نیشتیمانیە داوای ئازادیو سەربەخۆیی تەواوی بۆ هەموو ئەو هەرێمانە دەکرد کە زۆرینەی تورکن، لەنێو ئەوانەشدا ئەستەمبوڵو ناوچەکانی ئەستەمبووڵ کە تا دەریای مەرمەرە درێژدەبنەوە.[٣٩]

ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورە سەروەری تورکیایان ڕاگەیاند لە چوارچێوەی ئەو سنورەی کە میساقی نیشتیمانی بڕیاری لەسەر دابوو ئەنجومەنی نیشتیمانی خۆی بەتەنها دەسەلأتی یاسایی دادەنا لە ولأتدا کە لە خواستو ئارەزوی گەلەوە سەرچاوەی گرتبوو، لە٣ی مایسی ساڵی ١٩٢٠ دا حوکومەت دامەزرا بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمال، ئەنجوومەن

[٣٩] د.ابراهیم خلیل أحمد وخلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٢.

هەموو ئەو پەیماننامەو ڕێکەوتننامانەی کە حکومەتی سوڵتان گرێیدابوون لە میانەیدا ئیمزاکردنی ئاگربەستێی مۆدرۆسی لەگەڵ دەوڵەتە بیانیەکاندا هەڵوەشاندەوەو هەموو ئەو یاسایانەی کە دەرکرابوون لەلایەن ئەو حوکومەتەوە لەماوەی ١٦ی ئازاری ١٩٢٠ یاخود لە داگیرکردنی ئەستەمبوڵ لەلایەن هاوپەیمامانەوە ڕەتکردەوە.[٤٠]

مستەفا کەمال پاشا ئەنقەرەی کردە پێگەی خۆیو هەوڵیدا بۆ ڕێکخستنی هێزە بەرگریکارەکان بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هەموو ئەگەرەکان، سەرەڕای ئەوەش هێزە نیشتیمانیەکانی بانگهێشت کرد بۆ ئەنقەرە بۆ مەشق پێکردنو چەکدارکردنیان، سەرەڕای ئەو چەکانەی کە پێشتر شۆڕشگێرەکان دەستیان بەسەردا گرتبوو لە گەنجینەکانی هاوپەیمانانداا، زۆرینەی سەربازە تورکەکانیش چەکەکانیان لەئەنادۆڵدا شاردبۆوەو نەیاندابوو بەدەست هاوپەیمانانەوە.[٤١]

حکومەتی سوڵتانو هێزە وابەستەکانی هەوڵیاندا دەستبگرن بەسەر بزوتنەوەی کەمالیدا، بۆئەمەش سوڵتان فەرمانی دەرکرد داوای دەستگرتنی کرد بەسەر بزوتنەوەکەداو

---

[٤٠] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

[٤١] د.ابراهیم خلیل أحمد وخلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٣.

**داوای لەگەنجان کرد بێنە ژێربالّی سوپای خەلیفەوە.[٤٢] هەر لەبەرئەمە دادگای سەربازی لەئەستەمبولّ حوکمی لەسێدارەدانیدا (بەغیابی) بەسەر مستەفا کەمال‌و چەند سەرکردەیەکی تردا، شێخی ئیسلام لە ئەستەمولّ فەتوایدا مستەفا کەمال‌و چەند شوێنکەوتەیەکی بەدەرچوو لەدەسەلاّتی شەرعی دانا، نیشتیمانیەکانیش بەرپەرچی ئەوەیان دایەوە بەوەی موفتی ئەنقەرەیان والێکرد فەتوایەکی دژ بەوە بدات کەتیایدا فەتواکەی شێخولئیسلامی بەپوچەلّ دانا چونکە لەژێر سایەو هەڕەشەی داگیرکەری بیانیدا دەرچووە.[٤٣]**

**لەسالّی ١٩٢٠دا شەڕوپێکدادان ڕوویداو کەمالیەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا هەروەها شۆڕشگێڕەکان توانیان لەباشورو باشوری ڕۆژهەلاّتی ئەنادۆلّ سەرکەوتنی بەرچاو بەسەر فەڕەنسیەکاندا لە مەرعەش‌و ئورفەو عەنتاب‌و ئەدەنەو مێرسن بەدەست بهێنن، فەڕەنسی‌و ئینگلیزەکان ڕوبەڕووی شۆڕش‌و ڕاپەڕین بوونەوە لە عێراق‌و سوریا‌و میسر لەبەرئەوە بڕیاریاندا کە هێزی یۆنانی ڕاسپێرن بۆزالّبوون بەسەر کەمالیەکانداو جێبەجێکردنی سیاسەتی دەولەتە ئیمپریالیەکان لە تورکیا، هێرش‌و پەلاماری یۆنانی لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٢٠**

[٤٢] د.ابرهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

[٤٣] د.ابراهیم خلیل أحمد وخلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٤.

دەستپێکردو هێزەیۆنانیەکان توانیان هەندێ ناوچەی گرنگ لە ئەنادۆڵ و ڕۆژهەڵاتی تراقیا داگیر بکەن.[٤٤]

لەلایەکی ترەوە پەیماننامەی سیڤەر یارمەتی کەمالیەکانیدا لەئاڕاستەکردنی ڕق وتوڕەی خەڵك لە دژی نوێنەرانی بیانی و حوکومەتی سوڵتان هەستان بەدامەزراندنی سوپای نیزامی و داوای ژمارەیەك موالیدی کرد بۆ خزمەتی ڕێکخستنەوەی پاشماوەی هێزی نیزامی عوسمانی و هێزی چەکداری گشتی لەناوچە جیاوازەکانی ولاٌتدا بەمەش بزافی نیشتیمانی چووە قۆناغێکی نوێ لەمێژووی خۆیدا.[٤٥]

لەڕاستیدا سیاسەتی کەمالیەکان تەواوکەری سیاسەتی ئیتیحادیەکان بوو،[٤٦] هەروەك مستەفا کەمال لەساڵی ١٩٢٣دا دانی پێدادەنێ و دەڵێ: ئێمە هەمووما ئەندامی ئیتیحادو تەرەقی بووین.[٤٧]

---

[٤٤] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

[٤٥] هەمان سەرچاوە، ل٣٢.

[٤٦] کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین: کوردستان لەنێوان ململانێی نێو دەوڵەتی و ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢، بێ ژمارەی چاپ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٩١.

[٤٧] حەمید بۆز ئەرسەلان: وەرگێڕانی، نەجاتی عەبدوڵڵا، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٩، ل٤٨.

## باسی دووەم

## پەیوەندییەکانی بزوتنەوەی کەمالی:

## بزوتنەوەی کەمالیو پەیوەندییەکانی لەگەڵ سۆڤێت:

لەسەرئاستی دەرەکی کەمالیەکان لەهەوڵی دەستخستنی هاوکاری دەوڵەتاندابوون، لەهاوینی ١٩٢٠دا نزیکبوونەوەی تورکی سۆڤێتی دەستیپێکرد بەجۆرێك کە رووسەکان دەستیانکرد بەپێدانی چەكو تەقەمەنی هاوکاری دارایی بەکەمالیەکان.[٤٨]

لە ١٩ی شوباتی ١٩٢١ دا وەفدێکی حکومەتی تورکیا بە سەرۆکایەتی وەزیری ئابوری یوسف کمال بەگ (تنگرشك) گەیشتە مۆسکۆ،[٤٩] لە ١٢ی ئازاری١٩٢١دا پەیماننامە هاوکاری سەربازی لەنێوان هەردوولادا مۆرکرا، ڕێککەوتنی مۆسکۆ لە ئازاری ١٩٢١و قارس لەتشرینی یەکەمی ١٩٢١ بەسترا کە دەسکەوتێکی مێژوویی بوو بۆکەمالیەکان، ئەو دوو ڕێکەوتنە سنوری هەمیشەیی تورکیای لەگەڵ سۆڤیەت

---

[٤٨] هەمان سەرچاوە، ل٣٢-٣٣.

[٤٩] مجموعة من الباحثين السوفيت: سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٢.

**دیاریکرد بەهەرسێ کۆمارەکەی جۆرجیاو ئەرمینیاو ئازەربایجانەوە.[٥٠] لێرەدا کەمالیەکان هێزەکانی خۆیان کە بەرامبەر سۆڤیەت بوو کێشایانەوەو دژی ئەرمەنەکان بەکاریان هێنا.[٥١]**

**لەم کاتەدا پەیوەندی نێوان روسیای سۆڤیەتیو تورکیای کەمالی گەیشتە لوتکەو حکومەتی سۆڤیەت دانینا بە حکومەتی ئەنکەرەدا.[٥٢]**

## بزوتنەوەی کەمالیو کورد:

**مستەفا کەمال بۆ ئەنجامدانی پلانەکانی بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەڕوی زەمینیو مرۆییەوە پشتی بە کوردستان بەستبوو، چونکە ئەو ناوچانە تا ڕادەیەك دوور بوونو وەك ناوچەکانی تر نەکەوتبوونە ژێر دەستی هێزەکانی**

---

[٥٠] ماجد خلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤.

[٥١] محەمەد ڕەسول هاوار: کوردوباکوری کوردستان، بەرگی دووەم، چاپی دووەم،بەڕێوەبەرایەتی چاپو بلاْوکردنەوەی سلێمانی،٢٠٠٦، ل١٣٥.

[٥٢] د.ابرهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

**هاوپەیمانان.[٥٣] مستەفا کەمال بەتەواوی دەرکی بە بایەخی موسڵمانچێتی کردبوو، بۆ بەکارهێنانی وەك ئامرازێکی خەبات، بۆیە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە پێی لەسەر بانگەوازی برایەتی موسڵمانانو خەبات دژی گاوران داگرت.[٥٤]**

**لەسەرەتای جەنگی سەربەخۆییدا کە بە کۆنگرەی ئەرزرۆم لەساڵی ١٩١٩ دەستیپێکرد، لە کاتێکدا مستەفا کەمال جەنگی دژی یۆنانیو ئینگلیزو ئیتاڵیو فەرەنسیەکان لەیەك کاتدا بەرپاکرد، بە هەموو شێوەیەك هەوڵیدا بۆ باشکردن پەیوەندییەکانی لەگەڵ کوردەکاندا، تەنانەت ڕێزی خۆی بۆ بەهای عوسمانیو ئیسلامیو سوڵتان دەرخست، هەروەك جلوبەرگی کوردی لەبەر کرد، هەروەها وێنەی هەیە کە دەستی شێخانی ئاینیو سەرۆك عەشیرەتەکان ماچ دەکات، وێڕای ئەو نامەو بانگەشەو لێدوانانەی ئاراستەی سەرکردەو پێشەوا کوردەکانی دەکردو تیایدا دەیگووت: با ئێمە کوردو تورك پێکەوە دژی دوژمنی هاوبەش بجوڵێین.[٥٥]**

---

[٥٣] **کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩١.**

[٥٤] **هەمان سەرچاوە: ل١٩٢.**

[55] **د. وليد رضوان: موقف التيار الاسلامي والتيار العلماني في تركيا من القضية الكردية، الطبعة الاولى، دار النهج، حلب–سوريا، ٢٠٠٨.، ص٤٧.**

سەرکردە کوردەکان بەشدارییان لە گۆنگرەی ئەرزڕۆمدا کرد مەبدەئیەن دژی دەوڵەتی نەتەوەیی تورك نەبوون کە تیایدا کورد ئۆتۆنۆمی پێبدرێت. لەبەر ئەوە ژمارەیەکی زۆریان لە کۆنگرەی ئەرزرۆمدا بەشداریانکرد کە لەماوەی ١٠-٢٣تەموزی ١٩١٩دا بەسترا.[٥٦] لەڕاستیدا ژمارەیەك لە سەرکردە کوردەکان متمانەیان بە بەڵێنی کەمالیەکان کردبوو، کە بەڵێنی پێدانی مافە نەتەوەییەکانو پارێزگاری دەسەلاتیانی لە کوردستاندا پێدا بوون.[٥٧] لیژنەی سەرپەرشتی کۆنگرەی ئەرزرۆم کە لە ٨ کەس پێکهاتبوو سیانیان سەرکردە کوردەکان بوون ئەوانیش: شێخ فەوزی سەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندی لە ناوچەکانی ئازەربایجانو دەرسیم، و سعدالله بەگ لە خەڵکی سعرت کە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی (مبعوپاتی) عوسمانی بوو لە ساڵی ١٩١٨، و حاجی موسا بەگی میرزا زادە سەۆرکی عەشیرەتی موتکی.[٥٨]

---

[٥٦] هەمان سەرچاوە: ل٤٨.

[57] د. حامد محمود عیسی: القضیة الکردیة فی ترکیا، الطبعة الاولی، مکتبة مدبولی، القاهرة، ٢٠٠٢، ص١٥٥.

[٥٨] د. ولید رضوان: سەرچاوەی پێشوو، ص٥٣.

وێڕای ئەوەی ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورە کە لە ٣٥٠ ئەندام پێکهاتبوو ٧٢ کەسیان کورد بوون.[٥٩]

بەهۆی بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلام لەسەرەتای جەنگی سەربەخۆیی لەلایەك‌و بەهۆی دابەزینی سوپای یۆنانی لەسەر کەناراوەکانی ئەزمیر، کە هەستی ئایینی لەلای تورك‌و کوردەکان وروژاند لەلایەکی ترەوە، بەشێکی زۆری کوردەکانی تورکیا بەدەم داواکەی مستەفا کەمالەوە چوون، و کاتێك فەرەنسیەکان باشوری ڕۆژئاوای ئەنادۆڵیان داگیر کرد، کوردەکان لەگەڵ مستەفا کەمالدا لە هەردوو ساڵی ١٩٢٠و١٩٢١دا ئازایانە جەنگان، لەبەر ئەوەی ئەو ناوچانەی بەرگریان لێدەکرد نیشتیمانی سەرەکیان بوو.[٦٠]

هەروەها ئەوەی زیاتر یارمەتی ڕاکێشانی کوردەکانیدا، ڕاپەڕینی ئەرمەنەکان بوو، کە ناوجەرگەی کوردستانیان بە خاکی خۆیان دەزانی، ئەمەش مەترسیەکی گەورەی

---

[٥٩] ماجد خلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[٦٠] د. ولید رضوان: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢.

خستبووە دڵی کوردەکانەوە، تورکەکانیش زانایانە لە ژێی ئەو مەبەستەیان دەدا.[٦١]

هەروەك ڕۆڵی کوردەکان لە جەنگی ئینونوی مێژوویی و جەنگی سقاریای یەکلاکەرەوەدا کە خودی مستەفا کەمال سەرپەرشتی دەکرد ڕوون و دیار بوو، بە ئەندازەیەك کە یەکێك لە تیپە سوارەکانی کورد لە پێشەنگی سوپای تورکدا بوون کە چوونە ناو ئەزمیرو سوپای یۆنانیان بەرەو دەریا تێکشکاند، هەروەها سوپاکەی کازم قەرە بگیر کە جەنگی دژی ئەرمەنەکان بەرپا کرد زۆربەی لە کوردەکان پێکهاتبوو.[٦٢]

بەدەر لەوەی کە سەرکردە تورکەکان ئاماژەبە ڕۆڵی کورد لە ڕزگار کردنی تورکیادا دەکەن، هەروەك وەزیری بەرگری تورکیا لەکاتی وتاردانیدا لەسەر گۆڕی سەربازی ووندا گووتی: بەزۆری گومان بۆ ئەوە دەچێت کە ئەمە سەربازێکی کورد بێت.[٦٣]

---

[٦١] کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢.
[٦٢] د. ولید رضوان: سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢-٥٣.
[٦٣] د. حامد محمود عیسی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧-١٥٨.

**دەتوانین بڵێین سیاسەتی کەمالی بەرامبەر بەکورد سیاسەتێکی تاکتیکی بوو نەك ستراتیژی، توانیان سود لە پێگەو توانای کوردەکان وەربگرن بۆ سەرحستنی بزوتنەوەکەیان‌و دواتریش پشتیان کردە هەموو ئەو بەڵێنانەی بە کوردەکانیان دابوو لە ئازادی‌و مافە نەتەوەییەکانیان.**

## باسی سێیەم

## گرنگترین ڕوداوەکانی بزوتنەوەی کەمالیو سەرکەوتنی:

## گرنگترین جەنگەکانی بزوتنەوەی کەمالی:

پاش ئەوەی کۆنگرەی لەندەن کەلە١٢ی شوبات تا ١٤ی ئازاری ١٩٢١ گرێدرا بەڵام کۆنگرەی ناوبراو سەرکەوتوو نەبوو لە گەیشتن بە ڕێککەوتنێك چونکە دەوڵەتە ئیمپریالیەکان تا ئەوکاتەش سوربوون لەسەر سیاسەتی پێشووی خۆیان بەرامبەر بەتورکیا.[٦٤] جارێکی تر هاوپەیمانان هەوڵیاندا بەهێزی چەك کێشەی تورکیا چارەسەر بکەن بۆیە سوپای یۆنانی لە٢٣ی ئازاری ١٩٢١دا جارێکی تر هێرشیان کردە سەر هێزەکانی تورکیا، بەڕوی بەرەی بۆرسە – ئوشاك، ئامانجی سەرەکی هێرشەکە شاری ئاسکی شەهر بوو کە تیایدا هێڵی ئاسنی بەغداد لەگەڵ ئەنکەرە بەیەکدەگەن بەڵام پێکدادان دوای سێ ڕۆژ بەردەوام بوون لە نزیك گوندی ئینۆنۆ کۆتای هات بەسەرکەوتنی سوپای تورکیا، بەجۆرێك دوای ئەو شکستە گەورەیە هێزی

---

[٦٤] د. ابراهیم خلیل احمدو ئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

یۆنانیەکان گەڕانەوە شوێنی پێشووی خۆیان لە بۆرسە، هەروەها هێزی یۆنانیەکان سەرکەوتنی ستراتیژییان بەدەست نەدەهێنا بەئاڕاستەی قۆنیە سەرەڕای داگیرکردنی ئەفیون قەرە حەسار.[٦٥]

لەماوەی ٢٣ی ئاب تا ١٣ی ئەیلولی ١٩٢١ یەکێك لەتوندترین پێکدادانەکان لەمێژووی تورکیا ڕوویدا ئەویش جەنگی سەقاریایە کەهێزی کەمالی تیایدا سەرکەوتن، دژەهێرشێکیان دەستپێکرد لە ١٣ی ئەیلول یۆنانیەکانیان ڕاونا بۆ کەنارەکانی ڕۆژهەلاّتی ڕوباری سەقاریە.[٦٦] لێرەدا مستەفا کەمال نازناوی غازی پێدرا.[٦٧]

هەروەها نیشتیمانیە تورکەکان لەگەل فەڕنسا ڕێکەوتن لە٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢١دا کە ڕێککەوتنەکە لە ١٣ ماددە پێکهاتبوو، کەتیایدا فەڕەنسا وازیهێنا لەناوچەی (دیاربەکرو ماردین) لەگەلْ نیوەی درێژکراوەی نێوان سنوری ئێستاو چیای تەرتووس کە ویلایەتی ئەدەنە

---

[٦٥] مجموعة من الباحيثين: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٦.

[٦٦] د.ابرهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤.

[٦٧] ماجد خلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.

**دەگرێتەوە لەگەڵ مەرسین‌و طرسوس، واتە فەڕەنسا وازیهێنا لەناوچەیەکی ١٠-١٨ کم دووجا، لەبەرامبەر ئەمەدا ئەسکەندەرونە درا بە سوریا.[٦٨] لەئەنجامی ئەوەشدا فەڕەنسیەکان بڕێکی زۆر چەك‌و ئازوخەیاندا بەتورکیا، و هاوکاری نیشتیمانیە تورکەکانیان کرد بۆ بەردەوامبوونیان لە خەبات دژی یۆنانیەکان.[٦٩]**

**هەروەها ئیتالیەکان پاشەکشەیان کرد لەوناوچانەی کە داگیربانکردبوو لە باشوری ئەنادۆڵ، وەبڕێك چەکیان بۆنیشتیمانیە تورکەکان بەجێهێشت کەبووە هۆی بەهێزبوونیان‌و بڕیاریاندا ڕزگارکردنی ئەنادۆڵ‌و زەویە ئەوروپیەکانی تورکیا تەواو بکەن.[٧٠]**

**لە٦ی ئەیلولی ١٩٢٢دا دوای شەڕێکی قورس هێزی کەمالیەکان بۆرسەیان ڕزگارکردو هێزی یۆنانیەکانیان تێکشکاندو ١٣هەزاریان لێ بەدیلگرتن لەگەڵ بڕێکی زۆر لە چەك‌و تەقەمەنی لەنێوان دیلەکاندا ٥٠٠ ئەفسەرو جەنەڕاڵی**

---

**[٦٨] هەمان سەرچاوە، ل٢٤.**

**[٦٩] د.ابراهیم خلیل أحمد وخلیل علی مراد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٦.**

**[٧٠] هەمان سەرچاوە، ل ٢٣٦.**

تێدابوو، بەوشێوەیە یۆنانیەکان شوێنەکانی خۆیان یەك لەدوای یەك چۆڵ دەکرد.[71] لە٩ی ئەیلولدا لەئەزمیر کشانەوەو تورکەکان بەبێ تەقە چونە ناوییەوەو ئاگربەستیان کرد لەسەر داوای هاوپەیمانان لە١١ی تشرینی یەکەمدا .[72] لە١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢ کردەوەی سەربازی نێوان تورکیا ویۆنان ڕاگیراو هێزەکانی یۆنان لە توراقیای ڕۆژهەڵات کشانەوە لەماوەی یەك مانگدا، دامەزراوەکانی تورکیا لەم ناوچەیە دامەزرا.[73]

پاش ئەوە لەدانیشتنێکی ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورەی تورکیادا لە یەکی تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا یاسایەکیان دەرکرد بەجیاکردنەوەی دەسەڵات لەخیلافەت هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەت و گواستنەوەی هەموو دەسەڵاتەکانی وڵات بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورەی توکیا هەروەك هەستان بەدانانی خەلیفەیەکی نوێ لە بنەماڵەی عوسمانی.[74]

---

[71] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥.
[72] د.علي حسون : تأريخ الدولة العثمانية، الطبعة الرابعة، المكتب الاسلامي، بيروت –دمشق–عمان، ٢٠٠٢، ص٣٢٣.
[73] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.
[74] مجموعة من الباحثين السوفيت: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

## کۆنگرەی لۆزان و سەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالی:

کۆنگرەی لۆزان گرێدرا کە بەقۆناغی کۆتای جەنگی سەربەخۆیی تورکیا دادەنرێ لە لۆزان لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ لەگەڵ وەستانیدا بەردەوام بوو تا٢٤ی تەموزی ١٩٢٣ بەبەشداری هەریەکە لە بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو یابان و ڕۆمانیا و یوگسلافیا و یۆنان لەلایەك و تورکیا لە لایەکی تر، نوێنەری ویلایەتەیەگرتووەکانیش بەسیفەتی چاودێری بەشدارییان کرد.[٧٥]

لە پەیمانی لۆزاندا (کرزون) چوار مەرجی دانا بۆدانان بە سەربەخۆی تورکیادا کە ئەمانەبوون:

١. هەڵوەشاندوەی خیلافەتی ئیسلامی.
٢. دەرکردنی خەلیفەی عوسمانی بۆدەرەوەی وڵات.
٣. ڕگەیاندنی عەلمانیەتی وڵات .
٤. دەستگرتن بەسەر موڵکو سامانی بنەماڵەی عوسمانیدا.[٧٦]

---

[٧٥] د.ابرهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨.
[٧٦] محمود شاکر: الخلفاء العثمانیون، الطبع الاولی، المکتب الاسلامی، بیروت، ٢٠٠٣، ص٣١٤.

هێزی هاوپەیمانان هەستان بەچۆڵکردنی ناوچەی گەروەکان و ئەستەمبولً، تورکیاش دەستبەرداری هەموو جۆرە مافێکی خۆی بوو لەعێراق وسوریا وفەلەستین و ئەردەن و میسرو نیمچەدورگەی عەرەبی و لیبیا و قوبرس و دورگەی ئەلدودیکانیز.[٧٧]

له یەکی تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا دوای ئەوەی لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانیەوە ڕەتکرایەوە، پاشان بە هەڕەشەو لەژێر فشاری مستەفا کەمالدا دەسەڵاتی سوڵتانیان هەڵوەشاندەوەو لە خەلافەت جیایان کردەوە.[٧٨]

لە٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣دا ئەنجومەن دانیشتنێکی مێژوویی بەست و تیایدا کۆماری تورکیا ڕاگەیەنرا، لەئێوارەی هەمان ڕۆژدا مستەفا کەمال هاوڕێکەی خۆی عیسمەت ئینۆنۆی ڕاسپارد بۆ دامەزراندنی یەکەمین وەزارەت لە سەردەمی کۆماریدا.[٧٩]

---

[٧٧] د.ابڕهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.
[٧٨] هەمان سەرچاوە، ل٣٧.
[٧٩] ماجد خلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧.

لە٣ی ئازاری ١٩٢٤ خیلافەتو وەزارەتی ئەوقافی هەڵوەشاندەوەو خەلیفەو ئەندامانی بنەماڵەی عوسمانی دورخستەوە بۆدەرەوەی وڵاتو بێبەشی کردن لەڕەگەزنامەی تورکی هەروەك دەستیگرت بەسەر موڵكو ماڵەکانیدا.[٨٠]

لە٢٠ی نیسانی ١٩٢٤دا ئەنجومەنی نیشتیمانی گەورە بڕیاری لەسەر دەستوری نوێدا کە لە ماددەی٧دا دەسەڵاتی فراوان دەبەخشێتە سەرۆك کۆمار، ئەو سەرۆکی دەوڵەتەو سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانیشە.[٨١]

بەمەش کۆتایی بە خیلافەتی عوسمانی هاتو دەوڵەتی کۆماری تورکیا دامەزرا لە چوارچێوەی سیستەمو دەستورێکی عەلمانی نەتەوەیدا، کاریدەکرد لەسەر بە نەتەوە کردنی دەوڵەتو تەنها دانی بە بونی نەتەوەی تورکدا دەنا، ئەمەش لەژێر فشاردا بەسەر گۆمەڵگەی تورکیادا سەپێنرا.

---

[٨٠] د.ابرهیم خلیل احمدوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠.

[٨١] ماجد خلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٤١.

# ئەنجام

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانە کە دەتوانین لەم چەند خاڵدا بیانخەینە ڕوو:

١. لەسەرو بەندی جەنگی یەکەمی جیهانیدا دەسەڵاتی سیاسی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەدەست ئیتیحادییەکانەوە بوو، کە پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵ ئەڵمانەکاندا هەبوو، بۆیە بڕیاریاندا لە پاڵ وڵاتانی ناوەنداو دژ بە هاوپەیمانان بچنە جەنگەوە، وێڕای نا ڕەزامەندی ڕای گشتی عوسمانی.

٢. بزوتنەوەی کەمالی دەرئەنجامی ئەو بارودۆخە بوو کە بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا هات، لە سەپاندنی چەند مەرجو پەیماننامەیەك، بەهۆی شکستی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، ئەمەش لەتوانی گەلی تورکیادا نەبوو قبوڵی بکات بە تایبەتی هاتنی یۆنانەکان، کە بووە هۆی وروژاندنی لە ڕادەبەدەری گەلی تورکیا.

٣. مستەفا کەمال کەسایەتیەکی بە توانا و کاریزمای تورکیا بوو توانی هەلومەرجی نێو دەوڵەتی بە

قازانجی بزوتنەوەکەی بقۆزێتەوەو سود لە پەیوەندییەکانی لە گەڵ سۆڤێت و ململانێی نێوان هاوپەیمانان وەربگرێت بۆ سەرخستنی بزوتنەوەکەی.

٤. مستەفا کەمال توانی سود لە توانای بەشێکی بەرچاوی کوردەکان و پێگەی گرنگ و دەوڵەمەندی ناوچە کوردەکان وەربگرێت و کوردەکان بە بەڵێنی پێدانی مافە نەتەوایەتیەکانیان بەلای خۆیدا رابکێشێت، بێگومان ئەمەش سیاسەتێکی تاکتیکی بوو بەرامبەر بەکوردەکان بە کاریهێنا نەك سیاسەتێکی ستراتیژی.

٥. بزوتنەوەی کەمالی چەندین ڕوداوی گرنگ و جەنگی یەکلاکەرەوەی بەخۆوە بینی، کە توانی لەجەنگەکاندا سەرکەوتن بە دەست بهێنێت و یەك لە دوای یەك لەگەڵ وڵاتانی هاوپەیماندا رێکەوتننامە ببەستێت، دواتر لە کۆنگرەی لۆزاندا دان بە سەربەخۆیدا نرا.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە کوردیەکان:

١. د.ابراهیم خلیل احمدو ئەوانی تر: تورکیای هاوچەرخ، وەرکێڕانی، سامان مصطفی، چاپی یەکەم، چاپخانەی لاوکۆ، سلێمانی،٢٠٠٨.
٢. ئێریك جەی. زوچەر:مێژووی هاوچەرخی تورکیا، وەرگێڕانی، د. یاسین سەردەشتی، بێ ژمارەی چاپ، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٣. حەمید بۆز ئەرسەلان: وەرگێڕانی، نەجاتی عەبدوڵڵا، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٩.
٤. کامەران ئەحمەد محەمەد ئەمین: کوردستان لەنێوان ململانێی نێو دەوڵەتی و ناوچەییدا ١٨٩٠-١٩٣٢، بێ ژمارەی چاپ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
٥. مەحەمەد ڕەسول هاوار: کوردوباکوری کوردستان، بەرگی دووەم، چاپی

دووەم،بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی،٢٠٠٦.

## سەرچاوە عەرەبیەکان:

٦. د.ابراهیم خلیل احمدو د.خلیل علی مراد: ایران و ترکیا دراسة فی التاریخ الحدیث والمعاصر، بدون رقم الطبعة، دار الكتب، الموصل، ١٩٩٢.
٧. الامیر شكیب ارسلان: تاریخ الدولة العثمانیة، جمع أصوله وحققه وعلق علیه: حسن السماحي السویدان، الطبعة الاولی، دار ابن كثیر ودار التربیة، دمشق –بیروت، ٢٠٠١.
٨. د. حامد محمود عیسی: القضیة الكردیة فی تركیا، الطبعة الاولی، مكتبة مدبولی، القاهرة، ٢٠٠٢.
٩. عبدالرزاق الحسنی: تاریخ العراق السیاسی الحدیث، الجزء الاول، الطبعة السابعة، دار الشؤن الثقافیة العامة، بغداد، ١٩٨٩.

١٠. عبدالوهاب عباس القيسى و اخرون: تاريخ العالم الحديث ١٩١٤-١٩٤٥، الطبعة الاولى، وزارة التعليم العالى والبحث العلمى، ١٩٨٣.

١١. د.علي حسون: تأريخ الدولة العثمانية، الطبعة الرابعة، المكتب الاسلامي،بيروت –دمشق-عمان، ٢٠٠٢.

١٢. قادر سليم شمو:موقف الكورد من حرب الاستقلال التركية ١٩١٩-١٩٢٢، الطبعة الاولى، مطبعة خانى، دهوك، ٢٠٠٨.

١٣. د.محمد علي القوزي: دراسات في تأريخ العرب المعاصر، دار النهضة العربية، بيبروت-لبنان، الطبعة الأولى١٩٩٩.

١٤.محمود شاكر: الخلفاء العثمانيون، الطبع الاولى، المكتب الاسلامى، بيروت، ٢٠٠٣.

١٥. مجموعه من الباحيين السوفيت: تاريخ تركيا المعاصر، ترجمه د.هاشم صالح التكريتى، مؤسسه حمدى، بدون رقم الگبعه، السليمانيه، ٢٠٠٧.

١٦. د.وليد رضوان: موقف التيار الاسلامي والتيار العلماني في تركيا من القضية الكردية، الطبعة الاولى، دار النهج، حلب–سوريا، ٢٠٠٨.

## گۆڤارەکان:

١٧. گۆڤاری کۆچ، بیٚ شویٚنی چاپ، ژمارە٧–٨، ٢٠٠٨.
١٨. گۆڤاری میٚژوو،ژمارە٨، هەولیٚر،٢٠٠٨.